حەشەری دەکوتری.[ف]کنایه از زن عشقی

**کولله تانجیانە:** تاژیلۆکە، تاژیی ئەحمەد ڕاوکەر، بالبالووکە.[ف]آخوندک

**کوللەداشت:** کەوی دەستەمۆ و بە کوللە پەروەردە کراو، کەو یان هەر باڵندەیەک کە دەستەمۆ بکری و بە دەستندە کوللەی پێبدری.

[ف]پرندەای کە با دەست بە او ملخ میدهند

**کۆلمت:** جێگای پێکگەیشتنەوەی ئێسکی ڕان و دیزەڵەی سمت.[ف]مفصل استخوان ران و لگن

**کۆڵنج تەقاندن:** ☜ کۆڵنج شکاندن

**کۆڵنج شکاندن:** کەسێک کە کۆڵنج دەکا شانی بۆ دەشێلن یان دەیگوشن قرچەی لێوەدێ. *(شانم ڕەق بووە بزانە کۆڵنجم بۆ ناشکێنی)* [ف]قولنج شکاندن

**کۆڵنجی:** دووپشکە، دەمارەکوڵ. *(چزی دەڵێی چزی کۆڵنجییە بێگانە و خۆیی ناناسی)* [ف]عقرب

**کولنگ:** قەزوان، بەری داری بەن.[ف]پستەی کوهی

**کۆڵنەدەر:** نەبەز، ئازا، کەسێک کە نابەزێ و بە چۆکدا نایە. *(ئبا هەر ئێ تۆ بێ کەلیمەی کۆڵنەدەر/ ڕاپەڕە، تێکۆشە، با هەر سەرکەوی «حەقیقی»)* [ف]تسلیمناپذیر

**کوڵنەمە:** کوتانی یەکەمجاری برینج لە دینگدا.[ف]اولین کوبیدن برنج در هاون

**کۆلوبیر:** جەغجەغە، چەرخ و تەناقی ئاو هەڵگوێستن لە بیر.[ف]چرخ چاه

**کۆلودێ:** کۆلۆکۆ، خەم و کەسەر، خەفەت.[ف]اندوه

**کولوو:** (+) دەنکی بەفر، کلووی بەفر.[ف]دانەی برف

**کولوەس:** ڕەپستە، نەونەدە.[ف]گندم باران رویانده

**کۆڵە کوتان:** تەمبێ کردن و بەزاندن. برست لێبڕین. *(خەم وای کۆڵە کوتاوە ناتوانی زەردە بگری)* [ف]بیچارە و ناتوان کردن

**کۆڵە کوتران:** کۆڵەوار و لێقەومان، چارەڕەش. *(لەبن کۆڵی ڕیا کۆڵ و کەلاک و کۆڵە کوتراوم/ دەسم نەگری کوڵۆل و کۆڵەوارم یا ڕەسوولەڵڵا. «ڕاوچی»)* [ف]بیچارە و ناتوان شدن

**کۆڵە کوتراو:** برست لێبڕاو، لێقەوماو و زەلیل. [ف]بیچارە و ناتوان

**کوڵە گرتن:** خۆ گرتن، گوێ هەڵخستن بۆ قسەی خەڵک بە دزییەوە.[ف]استراق سمع

**کوڵە گوێنی:** ناوی گەمەیەکی لاوانە.[ف]نام یک بازی جوانان

**کولەباد:** نەترس، بێباک، بەغیرەت، بەجەرگ.[ف]بی‌باک

**کولەژ:** جۆرێک ماری ژەهراویی بقەیە.[ف]نوعی مار سمی خطرناک

**کۆڵەشیر:** کۆڵوشێر، دارێکی گەورەیە دەیدەنە بەر کۆڵەکەی ماڵ و بانەکەی پێ بەرز دەکەنەوە بەجۆرێک کە سەرێکی دارەکە لەژێر کۆڵەکەکە دایە و بە چەند کەس سەرەکەی تری دادەنەوێنن، وەک مەڵغە (ئەهرەم) بانەکەی پێ

بەرز دەکەنەوە، ئەوە بۆ کاتێکە کە دەیانەوێ شتێک بدەنە بەر کۆلەکەکە بۆئەوەی نەنیشێ، چلمیردە. [ف] اهرم

**کۆلەکەڕەشکە:** کۆلەکەیەک بوو سەرەکەی دوو فلیقانە بوو ڕەشکەکایان لەسەر دادەنا و ئەوسا پڕیان دەکرد لە کا و پاشان کەرەکەیان دێنا ژێری و باریان دەکرد بۆئەوەی سەر خستنەکەی ئاسان بێ. [ف] پایەای کە برای بار سنگین می‌گذارند و الاغ را در زیر آن قرار می‌دهند و بار می‌کنند

**کولەگڕوو:** کول هەستانی بەر لە گریان. ئۆناق. [ف] بغض گریه

**کولەگیر:** شۆقار، دووزمان، نەمام. [ف] خبرچین

**کولەهەیبە:** ماریکی ژەهراوییە، کولەوەیباب. کولەوەیوا. [ف] ماری سمی

**کولێرە ناسکە:** کولێرەیەک کە هەویرەکەی بە شیر و شەکر شێلدرابێ. [ف] نوعی نان روغنی خانگی

**کولێرەی پەنجەکێش:** کولێرەی قەرەپەپاغی. [ف] نوعی نان گرده

**کولێرەی حاجی لەکلەک:** تولەکە، ناوی گیایەکە گەلاکەی پان و خڕە گولێکی وردی سپی دەر دەکا و پاشان تۆوەکەی وەک کولێرە خڕە. [ف] نام گیاهی است، پنیرک

**کۆلێژ:** کولیج. [ف] کالج

**کۆلێژە:** تەنگانە، گیر و گرفت، تەنگژە. [ف] گرفتاری

**کولینجک:** کورۆشکە. [ف] غضروف

**کوم:** (+) کڵاو، تەپلە. [ف] کلاه

**کۆمانج:** کەوێڵ، کووژگە، چارداخ. [ف] سایبان

**کۆمەڵکە:** ☜ کۆمیلکە

**کۆمەڵکە:** کۆمەڵتە، کۆزیلکە. *(خەڵکێکی زۆر لەبەر درگای مزگەوت کۆمەڵکەیان بەستووە.)* [ف] جمع شدن عده‌ای بەدور هم

**کۆمیلکە:** کۆزیلکە، کۆمەڵکە، کۆمەڵتە. [ف] جمعیت

**کون کردن و لە مل کردن:** بریتی لە برسییەتی و خواردن و لستنەوەی قاپ و قابلەمە، خواردنی بنکڕی قابلەمە و مەنجەڵ. *(ئەو کرە کرە چییە سازت کردووە یەکجاری کونی کە و لە ملی کە.)* [ف] کنایه از گرسنگی و خوردن ته‌دیگ

**کوناوجە:** کوناوەجە، کلاوڕۆژنە، کولاوکە، ڕۆچنە، کولانچکە. [ف] روزنه‌ی بام

**کوناودیو:** دیواودەر، کوناودەر، *(دیوارەکەیان کوناودیو کردبوو.)* [ف] سوراخ شده از دو طرف

**کونجرە:** نووسەکە، پەنەرێشکە، نووسەنەکە، پەنیرێشک، پەزیشکە. [ف] تخم گیاهی خاردار که به لباس می‌چسبد

**کونجری:** کونجرە، پەرەنێشک، نووسەکە، نووسەنەکە، پەنیرێشک. [ف] گیاهی خاردار

**کونجەڵە:** کاسەی دارین، دەفری لە دار دروست کراو. [ف] کاسه‌ی چوبی

**کونجی کونجی:** خاڵ خاڵ، پنۆک پنۆک. *(ڕەنگی سێروو پایزانە کونجی کونجی دەبێ.)* [ف] خال خال ریز

**کونچکۆلی:** گەڕان و توێژینەوە، پەیدۆزی. [ف] تحقیق

**کوندەکی**: هەڵتروشکان، هەڵتووتەکان، کوندکی.ف چمباتمه‌زدن

**کوندەگایە**: جۆرێک کوندی گەورەیە.ف شاه‌بوف

**کوندەگوو**: بریتی لە منداڵی زۆر گووکەر. *(ئەو منداڵی کوندەگووم بۆ بەخێو کردووە.)* ف کنایه از بچه‌ای که زیاد می‌رید.

**کوندەمیز**: بریتی لە منداڵێک کە هەمیشە میز دەکا بەخۆیدا، میزکەر. *(ئەو کوندەمیزە شەو نییە جێگاکەی تەڕ نەکا.)* ف شاشو

**کونکە**: گۆزە، دەفری لە سواڵەت، کووزوو، جەڕە.ف کوزه

**کۆنە کتێب**: بریتی لە پیاوی بە ئەزموون و دنیا دیتوو.ف کنایه از پیرمرد با تجربه و دنیا دیده

**کونەباچکە**: دربیچە، پەنجەرەی چکۆڵە لە دیواردا بۆئەوەی بای لێوە بێتە ژووریّ، دەلاقە. ف دریچه

**کۆنەپارێز**: کۆنەپەرەست.ف مرتجع

**کونەپەنیر**: ئەشکەوتێک بوو قەدیم خەڵکی دێهاتی دەوروبەر پەنیریان لەویّ لە چاڵ دەنا و نگابانیان بۆ دادەنا.ف غاری بود در قدیم که آهالی روستاهای دوروبر پنیر خود را در آن نگهداری می‌کردند

**کونەجەرگ**: زۆر بۆ هێنان بە قسە و تانە و تەشەر. *(مێندە دەبۆڵێنی کونەجەرگی کردووم.)* ف بیزار کردن

**کونەلان**: لانی کوێرە، کونە هێلانە، دژی گەرمەلان.ف کهنه لانه‌ی خرگوش

**کۆنینەناس**: دێرینەناس.ف باستان‌شناس

**کووتی کووتی**: ) بانگ کردنی سەگ؛ ) بریتی لە مرۆڤی زگەڕۆ و بە تەماح کە چاوەڕێی بۆرە خوڵکێکە. *(ئەتوی عەلی بەردەشانی/ کووتی کووتی نانی نانی/ دوو کونم هەیە لەنێو ڕانی/ لە کای دەخۆی یان لە دانی «بەیتی عەلی بەردەشانی».)* ف ) صدا زدن سگ؛ ) کنایه از آدمی که حریص و شکمو است

**کووچان**: پڕ، لێوڕێژ، کەلاوڕێژ، لپاولپ. *(کیلەکەی کووچان کرد لە گەنم و بوی کردە جەواڵەکەوە.)* ف پر، لبریز

**کووچی کووچی**: بانگ کردنی سەگی چکۆڵە و تووتک.ف صدا زدن سگ کوچولو

**کووخەڵ**: نگابانی خرمان، خرمانەوان.ف نگهبان خرمن

**کوودی قەباخی**: کوولەکەی شەقەباخی.ف کدوحلوایی

**کوودی ملکە**: کوولەکە سەراوی.ف نوعی کدو

**کوورنگە**: سەر بە یەکا کردنی پەز لەبەر گەرمای هاوین(پەزەکان لە گەرمانا هەموو کوورنگەیان کردووە.) ف سر در هم فرو بردن گوسفندان در گرمای تابستان

**کووژگە**: کەوێڵ، کەپر، زنج، چارداخ.ف سایبان

**کووس**: کۆس، کۆست.ف طالع، بخت.

**کووس کەفتن**: بەدبەخت بوون.ف بدبخت شدن

**کووک**: کۆم، کووڕ.ف کوژپشت

**کووکوورەک**: تاقتاقکەرە، تووتەک. *(سی چت لەی دنیا شەومال نەیرن خاو/ هەوەل*

*کوکـوورەک، دووهـەم ناڵـەی ئـاو/ سـێیەم ئـەو کەسـەی لـە دڵ کریایـە/ وە زڵـف لـەیلـی زنجیـر کریایە، گۆرانی.)* ف یاکریم

**کوولەکە ترشی:** کوولەکەی شەقەباخی. ف نوعی کدو.

**کوولـەکـە چنـار:** جۆرێـک دارچنـاری قرچۆکـە راسـت هـەڵنـاچێ و شـتێکی خـڕ دەگـرێ و نێوەکەی پڕ دەبێ لـە مێشوولە. ف نوعی چنار شکننده و نامرغوب.

**کوولەکە دەروێشی:** کوولەکە سەراوی. ف نوعی کدو

**کووم:** (+) بـاک، ترس، *(کوڕ ئازا لـە هـیچ کـووم نییەکیگ.)* ف باک

**کوەک:** کەو، ژەرەژ، دوراج. ف کبک

**کوێخا سجیل:** ☜ سجیلنووس

**کوێرکێش:** چاوساغ، کەسێک کە دەستی کوێر دەگرێ و دەیگێڕێ. ف کسی کە دست آدم کور را میگیرد و راهنمایی میکند

**کوێرگوان:** حەیوانێ کە شیری کەم تێدابێ، یان گوانی شیری کەم لێدێ. ف دامی کە بەخوبی شیر از پستانش بیرون نمیآید

**کوێرووە رەقە:** ئافەتی گەنم، جۆرێ کوێرووە لـە گـەنـم پـەیـدا دەبـێ و دەنکـەکـەی رەقـە. ف سیاهک گندم

**کوێرە دمەڵ:** جۆرێ زیبکەی گەورەی زۆر بە ژانە دەرکی نابێ. ف نوعی دمل چرکی

**کوێرە کوان:** ☜ کوێرە دمەڵ

**کوێرەچاو:** قوولکێکە لـەبـەر چاوی پـەز دایـە. ف گودی زیر چشم گوسفند

**کوێرەمرە:** ئاوری بە تەپاڵە و دووکەڵ کردوو. *(تەندوورەکەی بێئەوەی کوێرەمرە بێ گرتی.)* ف آتش با دود

**کەپرە شینەی جوولەکە:** بـارانی هاوینـان، بـاران لە هاویندا. ف باران در تابستان

**کەپسوول:** ) کەفسوول، جۆرێ حەبی ناوگەدەیە زیاتر بۆ چڵکی لەش دەبێ؛ ) دەفری گاز، بەتڵی غاز. ف ) قرص کپسول؛ ) کپسول گاز

**کەپڕ راسان:** ☜ لووت راسان

**کـەپـەناشـی:** بـەربـووک، پێخـەسـوو. ف زنی کە همراه عروس به خانەی داماد میرود

**کـەپـەنکی پاش باران:** بریتی لـە شـتێک کـە لـە کـاتی بـە کـەڵک هاتنیدا دەسـت ناکـەوێ، دوای ئەوەی پێویستت پێیـنـەمـا پـەیدا دەبێ. ف کپنک بعد از باران

**کـەتـەوڵ:** قـەشـقە، گیایـەکە لـەنێو گـەنمدا شـین دەبـێ گوڵـەکـەی سـپییە و دانـەکـەی وەک نووسەکە وایە بـەڵام درووەکەی ئەستوورە. ف گیاهی خاردار

**کەتەوڵ:** گیایەکی دڕکاوییەگوڵی سپی دەردەکا، قـەشـقـە، گیایـەکـە وەک کـونجرە وایـە درووی دانەکەی درشتترە. ف گیاهی خاردار.

**کەچەڵ و کوونی:** بریتی لە دوو کەس کە بـەبێ یـەک هـەڵناکـەن.جووتـەی خێروشـەڕ ف کنایـە از دو نفر کە همیشە باهم هستند.

**کەچەوەترِێن:** ڕوو شـکاندن، شـەرمـەزار کـردن، کەچەترِین. *(وایان کەچەوەترِێن کرد ڕوو لەم لایە*

*ناکاتەوە.)* ف شرمسار کردن

**کەڕاژە:** کرێژ، کەرەکیفە، چڵکی پێکەوە نووساوی ڕەق بوو. ف چرک، کپک

**کەراکە:** کاژەلاک، کاسە سەر، تەپلە سەر. ف جمجمە

**کەراکەسەر:** تەپڵەسەر، تۆقەسەر، کاسەسەر. ف جمجمە

**کەراوکەر کەوتن:** بە یەک گەیشتنی دوو کەسی ناحاڵی کە دەست دەکەن بە کێشە و دەمەقاڵێ و بە کەس لێک نەبنەوە. *(تازە کەراوکەر کەوتوون بە کەس حاڵی نابن.)* ف کنایە از جدال میان دو آدم نفهم

**کەرپنج:** جۆرێک بێژانی گوڵ گەورەیە. ف نوعی گیاه بومادران

**کەرتاو:** ئاوێ کە لە چۆم جیا دەکرێتەوە، شەقە جۆگە. ف جوی بزرگ

**کەردڵ:** دڵکەر، بێخەم، کەسێک کە گوێی لە هیچ نییە و دنیای بە فشە وەبەرداوە. ف خردل

**کەردوو:** (+) دێراو، بۆ. ف جوی کە بر لبەی آن میوە می‌کارند

**کەردووکێش:** (+) ئامرازێکی دەم پانە پەتێک و دەسکێکی وەک پیمەرەی پێوەیە بە دوو کەس دێراوی پێ‌هەڵدەدەن. ف گراز

**کەرەی بەیانی:** تاریک و ڕوونی بەیانی، بەیانی زوو. *(کەرەی بەیانی گەیشتنە سەری و گرتیان.)* ف صبح کاذب

**کەرکت:** عەبای بێ‌قۆڵ. ف قبای بدون ئاستین

**کەرکۆڵک:** کەرکۆڵ، قاڵغان. ف گیاهی است خاردار

**کەرکە:** قاخنات، فرۆ. قاقنات، خۆراکێکە لە ژەک و شیر. ف آغوز

**کەرکەرۆک:** بەرزایی نێو درگا کە هەنگاوی بەسەردا هەڵدێننەوە. ف بلندی چهارچوب پایینی در

**کەرکەروکە:** ☜ کەرکەرۆک

**کەرکەرۆکە:** بەرزایی پێش دەرگا، لای خوارووی چوارچێوەی درگا کە لە عەرزەکە بەرزترە. ف طرف پایینی چهارچوب در

**کەرگ:** کەڕوو، بڕش، برشوو، کەرەکیفە، کەڕاژە. ف کپک

**کەرگەتەشی:** کەرتەشی. ف گیاهی خاردار

**کەرگەدەن:** (+) بریتی لە مرۆڤی زەلام و نەفام. ف کنایە از آدن لندهور و ابلە

**کەرگەوز:** شوێنی خو گەوزاندنی گوێدرێژ، شوێنێک کە خۆڵەمێشی لێ‌بێ و چەند جار کەر خۆی لێ گەوزاندبێ هەر کەرێکیتر دەگاتە ئەو حاندە ئەگەر باریشی لێ‌نرابێ خۆی دەدا بە عەرزدا و خۆی دەگەوزێنێ. ف غلطیدن الاغ روی خاکستر

**کەرگێرەوە:** پەرژین و بەربەست دانان لە دەوری بێستان و شوێنی تازە سواغ کراو بۆئەوەی وەنێوی نەکەون. *(ئەو سەربانەم تازە سواغ کردووە پەتێکی بە دەوردا ڕایەڵ کە بۆ کەرگێرەوە با وەنێوی نەکەون.)* ف نشانەای کە برای بستن معبر می‌گذارند

**کەرماشێن:** بە تانە و تەشەر بە پاسکیل دەڵێن،

دووچەرخە.[ف] دوچرخە

**کەرملاندن**: تێکەڵ کردن، ئاوێتە کردن، پاڵوش. [ف] آمیختە کردن

**کەرمێز**: ☜ خەرمێز

**کەرنەڤاڵ**: کۆ بوونەوە و بەڕێوەبردنی ئاهەنگ. [ف] کارناوال

**کەروێشک بە عەڕابە گرتن**: بریتی لە سەبر و تاملی زۆر. *(مێندە بە سەبرە کەروێشک بە عەرابە دەگری.)* [ف] کنایە از صبر و شکیبایی زیاد

**کەروێشکە مەلە**: مەلە کەروێشکە، جۆرێ مەلەی وەک کەروێشک.[ف] شنای خرگوشی

**کەرەب**: خەم، کەسەر، خەفەت.[ف] اندوە

**کەرەپەشمە**: گێژ و حۆل، حەپۆل، گەوج و وڕ. [ف] پخمە

**کەرەجنە**: جانەوەرێکە لە جێگەی تەڕ و شێداری ماڵدا دەژی، ڕەنگی خۆڵەمێشییە و بن زگی سپی و لاقی وردە، کەرەکەوڵە.[ف] نام حشرەای است

**کەرەستی**: شوێنی سێبەر، جێی هەمیشە سێبەر، تاونەگر.[ف] جایی کە هەمیشە سایە است

**کەرەسیسە**: (+) ئاپۆرەی ئاژەڵ و باڵندە یان مرۆڤ، *(پۆلێک باڵدار لەسەر سەلوێنکەکە کەرەسیسەیان داوە.)* [ف] انبوە مردم یا حیوانات

**کەرەعەوام**: پیاوی نەزان و گەمژە، حەپۆل، خەڵکی ڕەشوکیی گێل و نەزان.[ف] مرد ابلە

**کەرەک**: بەدبەدە، کەرەواڵە، مرەکەرە، هەوێردە. [ف] بلدرچین

**کەرەکۆشە**: ☜ کەرەوشە

**کەرەکوندە**: جۆرێ کوندە بەقەد کەوێک دەبێ زۆری لێ نزیک دەبییەوە هەڵنافڕێ.[ف] نوعی جغد

**کەرەکەوڵە**: کەرەجنە، جانەوەرێکی بچووکە لەجێگای تەڕ و شێداری ماڵدا دەژی.[ف] نام حشرەای است

**کەرەکیف**: کەڕوو، بڕش، کەرەکیفە، کەرگ.[ف] کفک

**کەرەنسێ**: جێگای نیسێ کە قەت تاو لێی نادا، شوێنی هەتاو نەگر.[ف] جایی کە آفتاب نمی‌گیرد

**کەرەنگەڵ**: قانگەلاشک، قانگەلۆشک، کەنگەلاشک.[ف] بتە خشک کنگر

**کەرەوشە**: جۆرێک جەگەن. کەرەکۆشە.[ف] جگن

**کەری کەندەلان**: بریتی لە کەسێک کە هەر بە لاڕێدا دەڕوا و خێشەسەرە. *(دەڵێی کەری کەندەلانە حەز بە تووپینی خۆی دەکا بۆئەوەی زەرەر لە خاوەنەکەی بکەوێ.)* [ف] کنایە از آدم خیرەسر

**کەری نیوەزەڕ**: ) بریتی لە کەسێک کە دێ قسە بکا و ناهێڵن تەواوی بکا؛ ) کاتێک کەر دەیهەوێ بزەڕێنێ لێی دەدەن و ناهێڵن زەڕە زەڕەکەی تەواو بێ.[ف] ) کنایە از کسی کە نمی‌گذارند حرفش تمام بشود؛ ) خری کە نمی‌گذارند عرعرش بە پایان برسد و با زدن قطع می‌کنند

**کەرێ**: کاژیلە، کاژیلەی شەش مانگان.[ف] بزغالەی شش ماهە

**کەریزکەن**: کەسێک کە بیر و کەریز هەڵدەکەنێ. ف مقنی

**کەزیک**: (+) دەمار، ڕەگی ئەندام. ف عصب

**کەزیلە**: پینەی مەشکە کە پەڕۆیەک بە دەرزی لە کونەکەی ڕا دەکەن. ف وصلەی مشک

**کەژاواژ**: خاڵ خاڵ بوونی دەشت و کێو لە کاتی دەمەو بەهاردا. *(زەوی کەژاواژ بووە.)* ف خال خال شدن دشت و کوە در اوایل بهار

**کەژتەنگ**: جاڕز، کەشتەنگ، تووڕە، مڕ و مۆچ و بێتاقەت. عصبانی و بیحوصلە

**کەژوان**: ) کەژەوان، شاخەوان؛ ) ناوی کوڕانە. ف ) کوهنورد؛ ) نام پسرانە

**کەس لە کەس**: ) بێسەرەوبەرە، *(کەس لە کەسێکە سەگ ساحەبی خۆی ناناسێ)* ؛ ) حیساب پاک بوون و پاک کردنی قەرز. *(بەخشین لە گوناە و هەڵە چاوپۆشینە/ تۆ چۆن هەرەشەت بە ئاگری پڕتینە/ بمبەخشی بە نوێژانەوە کەسمان لە کەسە/ بە گوناهەوە بمبەخشە دەڵێم بەخشینە. «هەژار، خەیام بە کوردی».)* ف ) بێبند و باری بلبشو؛ ) پاک شدن حساب

**کەسنەزان**: (+) ناوی دارێکی دڕکاوییە وەک شۆڕەتوو وایە، دارە بۆق. ف نام درختی است

**کەشار**: ڕۆخ، کەنار، لێواری زەریا. ف ساحل

**کەشک نانەوە**: ناوی یارییەکی لاوانە. ف نام یک بازی جوانان

**کەشکەبەڕۆنە**: سیریژێک کە هێندێ ڕۆنی تێکەڵ دەکەن و ئەوسا دەیکەن بە کەشک. ف کشک روغنی

**کەشکەرە**: قشقەڕە، قشقەڵە. ف زاغ سفید و سیاه

**کەشەور**: کەشەهەور، هەوری تەنک و پەڵە پەڵە بە ئاسمانەوە. ف لکەهای ابر سفید

**کەشیش**: (+) کورتە باڵا، خڕیلانە، قوڵەبنە. ف قد کوتاه، کوتولە

**کەف هەڵخراندن**: بریتی لە زۆر تووڕەبوون. *(هێندەی ڕق هەستابوو کەفی هەڵدەخراند.)* ف کنایە از عصبانی شدن زیاد

**کەفت و ڕەفت**: ) ☜ کەوت و ڕەوت؛ ) بریتی لە جاروبار، بە هەڵکەوت. *(خەم لە دڵی خەڵکی بە کەفت و ڕەفتەن/ خەم لە دڵەکەی من وە خەروار کەفتەن«فۆلکلۆر».)* ف ) افت و خیز؛ ) گاهگاهی

**کەفتیر**: کەوگیر. ف کفگیر

**کەفدەم**: بریتی لە زۆربڵێ و چەنەوەر، مرۆڤی گێژ و حەپۆل و زۆرویژ، کەسێک کە هێندە هەڵەوەڕی دەکا فریا ناکەوێ تفی دەمی قوت داتەوە. ف وراج

**کەفسوول**: ☜ کەپسوول

**کەفەسەر**: کەفەڕێز، لپاولپ، لێواولێو. ف لبریز

**کەفەکوڵێ**: ئەو شیرەی وردە بەردی سپیی لەنێو دەکەن و لەسەر ئاگری دادەنێن بۆئەوەی زووتر بکوڵێ و هەڵنەچێ. ف شیری کە برای جوشاندن سنگ سفید در آن میگذارند

**کەڤین**: (+) ) وەک کەو ، کەو وێنە، خاڵ لە ڕوو، ڕووبەخاڵ، ) ناوی کچانە. ف ) صورت خالدارو زیبا شبیه کبک. ) نام دخترانە.

**کەککە:** کەکە، قەقە، نوقڵ و شیرینی بە زاراوەی منداڵ. *(کەککە دەخوی؟)* ف شیرینی و شکلات در اصطلاح بچەها

**کەڵبەدوون:** عەبای دەورگیراو بە زەڕی و دەزووی ڕەنگاوڕەنگ. ف گلابتوون

**کەڵپانیر:** ) پاڵاخی دوو ساڵە؛ ) بریتی لە لاوی قەڵەو و زەبەلاح. ف ) گاومیش دو سالە؛ ) کنایە از جوان چاق و لندهور

**کەڵپەک:** کەپەک، درشتەی ئاردی دابێژراو، تیخوڵی گەنمی لە ئاش کراو. ف سبوس

**کەڵپینچە:** مشتەکوڵە. ف سقلمبە

**کەڵتەوەن:** نامۆ، غەوارە، نەناسراو، بێگانە، تاچیک. ف بیگانە

**کەڵخە:** ) کەمچە، ئامرازی قورە سواخ لووس کردن؛ ) مەلاقە، ئەسکوی، ئەستی، کەوچکی گەورە. ف ) مالەی بنایی؛ ) ملاقە

**کەڵک:** (+) تیرەگ، تەپک، تەپۆلکە، گرد. ف تپە

**کەڵکەلەمێشە:** کاکڵەمێشان، داپیرۆشک. کاڵکەمووشان. ف عنکبوت بزرگ

**کەڵکە خەراوە:** کاولاش، کەلاوە. ف خرابە

**کەڵلا:** ) +) دەم لە پێش و زۆربڵی، خۆ تی هەڵقوتێن و چەنەوەر. ف وراج

**کەڵلک:** کەلاوە، کاولاش، وێرانە. ف خرابە

**کەڵوو:** ) +) قۆزاخەی کرمی هەورێشم. ف پیلەی کرم ابریشم

**کەڵوەڕێژ:** پەڕینی نۆک و نیسک. نۆک و نیسکێک کە زۆر دەگا و دەستی بۆ دەبەی کەلوەکەی دەتەقی و دەوەری. *(تازە نۆکەکە بۆ ڕنینەوە نابی هەمووی کەڵوەڕێژ بووە.)* ف نخود یا عدسی کە بیش‌ازحد رسیدە و خشک شدەباشد

**کەڵوەز:** ئەشکەوت، ئەشکەفت. ف غار

**کەڵەبا:** بەدەمار، بەپۆز، تڕزل، قۆڕەدەماخ. ف متکبر

**کەڵەباب بە لەپەوە لێنان:** بریتی لە دڵنیابوون، لە خەم ڕەخسان. بریتی لە لاوێک کە ژنێکی باشی هێناوە وازی لە قیتەقیت و هاتووچۆ هێناوە. *(تۆ تازە کەڵەبابی خۆت بە لەپەوە لێناوە.)* ف کنایە از خاطرجمع شدن

**کەڵەبابە:** ئامرازێکی مەکینەی خەیاتییە مەکووکە دەچێتە ناوییەوە. ف کمپلت

**کەڵەباد:** بای وادە، شەماڵی سەرە بەهار کە بەفر دەتوێنێتەوە، بای وەعدە. *(هاتای کەڵەباد، باد بەهاران/ ولیعەهد دەشت، وکیل واران.)* ف باد بهاری

**کەڵەبەندەن:** چیای ڕژد و هەڵەمووت و ئەستەم. ف کوە صعب‌العبور

**کەڵەپۆ:** ) ئاسۆ، شوێنی خورئاوا بوون؛ *(کەڵەپۆی خۆرنشین تەم دایگرتووە.)* ) بەلال، گەرمەشانیی برژاو. ف ) افق؛ ) بلال

**کەڵەزات:** ترسەنۆک، خوێڕی. ف ترسو

**کەڵەزراو:** کەڵەزات، ترسەنۆک. ف ترسو

**کەڵەزەڕ:** بریتی لە زۆرداری بێڕەحم و دڵڕەق، زاڵمی بێبەزە. ف کنایە از آدم ظالم و سنگدل

**کەڵەزەنگ:** زەنگی گەورەی کڵێسە، گازەنگ. ف ناقووس

**کەڵەسوو**: مانگایەک کە لە کەڵ ناچێتەوە و ئاوس نابێ.[ف]گاو مادەای کە همواره آمادەی جفتگیری است و آبستن نمی‌شود

**کەڵەشێرە**: ) نەخۆشییەکە زیاتر زارۆکان تووشی دەبن دەنگیان دەنووسێ و دەکۆخن دەنگی کۆخەکەیان وەک خوێندنی کەڵەشێری لێ‌دێ؛ ) لەوزە، بایەمە، لەوزەی گەورە.[ف]) بیماری خروسک؛ ) لوزه

**کەڵەشێرە خودایلە**: پەپووسلێمانکە، خاتوون سێمانکە، شانەسەرە.[ف]هدهد

**کەڵەشێری ناوادە**: ) کەڵەشێرێک کە لە ناوەختدا دەخوێنێ. ) بریتی لەکەسێک کەلەوەخت و بێ‌وەختدا دەبێتە مڵۆزمی خەڵکی.[ف]) خروس بی‌محل ) کسی که نابهنگام مزاحم مردم می‌شود

**کەلەشینکۆف**: جۆرێ تفەنگی دەسکاری ڕووسیایە سێ گوللە دەخوا ئەو کەسەی دروستی کرد خۆی ناوی کلاشینکوف بوو.[ف]تفنگ کلاشینکف

**کەڵەکەبڕێ**: ناوی گەمەیەکی لاوانە. پۆلێک لاو بەدەورە دەست دەخەنە سەرشانی یەکتر و سەریان پێکەوە دەنێن، کەسێکیش دە هەنگاو دوور دەکەوێتەوە و بە هەڵاتن دڕوا دەست دەخاتە سەرشانیان و باز دەداتە ئەودیو.[ف]نام یک بازی جوانان

**کەڵەگژەو**: وشەیەکە کاتێک جوانەگا دەبەن بۆ سەر مانگا بەکەڵ بۆ دنەدانی جوانەگاکە دەیڵێن.[ف]کلمەای برای تحریک کردن گاو هنگام جفتگیری.

**کەڵەگژ**: ☜ کەڵەگژەو

**کەلەم کاشوول**: گیایەکی خوڕسک و بۆنخۆشە گەلاکەی دەخورێ و بۆ ترشیاتیش دەبێ. وەک کەرەوز وایە.[ف]نام گیاهی خوراکی

**کەڵەنگ**: قەلادە، قەرێتە، قەلاتە، سەنجۆل، قایشی ملی تاژی.[ف]قلاده

**کەلەواژ بوونەوە**: سەرنگوون بوون، خلۆر بوونەوە.[ف]سرنگون شدن

**کەڵوە**: کەڵەوانە، دووداری چەماوەیە بە نیریدا دەکەن و ملی گایەکە دەخەنە بەینییەوە و لە بنەوە بە بەن کەڵوە دەیبەستن.[ف]چنبرەی گردن گاو در خیش

**کەڵەوەکێشی**: دژایەتی، ڕقەبەری. *(ئەو خوێنییە دەیەوێ کەڵەوەکێشیم لەگەڵ بکا.)* [ف]رقابت کینەتوزانە

**کەمازەنگ**: جۆرێ کەمایە بەقەد کەما بەرز نابێتەوە.[ف]نام گیاهی است

**کەماسا**: سواڵکەر، خوازەڵۆک، دەرۆزەکەر.[ف] گدا

**کەمچە**: (+) ئەسکوێ، کەوچکی گەورە.[ف]ملاقه

**کەمچەکوڵە**: کەوچکە قوڵە، کلکەتەشی، بەچکەی بۆق کە هێشتا کلکی دەر نەهاتبێ.[ف]بچە قورباغە کە هنوز دست و پایش بیرون نیامده.

**کەمدەم**: کەسێک کە لە خواردندا شینەیییە. *(هێندە کەمدەمە لەوساوە دوو پارووی نان نەخواردووە.)* [ف]کسی که در غذا خوردن کند باشد

**کەمکولۆت**: کۆن و چەپڵەک، لەکار کەوتوو. *(بەجاری کەمکولۆت بووە کەڵکی نەماوە.)* کهنە و از کار افتادە

**کەمەن بەسەرێ**: گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە. ف نام یک بازی جوانان

**کەند و لەند**: زەویی پڕ قوولکە و چاڵ و چۆڵ. *(دێم بەرەو زوورک و تەلان و کەند و لەند/ دێم بەرەو بژوێن و زەنوێر و زەمەند. «هێمن».)* ف زمین پست و بلند

**کەندوور**: ئاودڕ، کەندڕ، بوودڕ. ف گودال آبکند

**کەنگەلاشک**: قنگەلاشک، قانگەلاشک، دڕووی کەنگر، قەلقەلاشک. ف بتە کنگر

**کەوت و ڕەوت**: هەستان و کەوتنەوە. *(وا پیر بووە کەوتۆتە کەوت و ڕەوت.)* ف افت و خیز

**کەوتنە سەر پێ**: کەوتنە سەر هەوا، لە کەللە دان. *(تازە کەوتۆتە سەر پێ بشێکۆژی هەر دەچێ.)* ف بە سرش افتادە

**کەوچک بەدەست**: بریتی لە کەیخودا و کاربەدەست. *(کەوچک بەدەستی ئەو ماڵە هەر ئەوە.)* ف مسئول

**کەوچکە قوڵە**: ☜ کلکەتەشی

**کەوچکە ماسی**: ) گوێچکە ماسی، گۆش ماساو؛ ) جۆرێ ماسییە دەمی وەک کەوچک وایە. ف ) گوش ماهی؛ ) نوعی ماهی، بیل ماهی

**کەوزیلگ**: ترسەنۆک، کەلەزات، کەلەزراو. ف ترسو

**کەوش**: (+) سەحرا، دەشت و مەزرا. *(گووەند لە کەوشە دوور لە وشکە سۆفین/ دەرفەتە مەم گوشین و هەڵگۆفین «هەژار».)* ف صحرا

**کەوشگەر**: کەوشدروو، پینەچی. ف کفشدوز

**کەوکز**: سوڵتان، شا، حاکم. ف سلطان، حاکم

**کەوکەوەڕاو**: ملەقوتێ و ڕابواردن و گەڕان. *(بەو ڕۆژگارە خەریکی کەوکەوەڕاوە.)* ف گشتن و کیف کردن

**کەونارا**: کۆن و لەمێژینە، کەڤنارا، دێرین. ف باستان

**کەونارا**: مێژینە، قەدیم، ڕۆژگارانی زوو. ف باستان

**کەونەلان**: ) کۆنەلان؛ ) بریتی لە جێگە ژیانی ڕابردوو. *(ڕوو لە هەرلایە دەکەم نامۆیە بۆ مۆم/ نابینم جێژوان و کەونەلانی خۆم. «هێمن».)* ف ) لانەی کهنە؛ ) محل زندگی قبلی

**کەوەحەفی**: کەومار، ماری باڵدار. ف مار پرندە

**کەوەرە**: (+) قەراخ، کەنار، دیواری قەراغ حەوز و کانی. *(لە پاڵ کەوەرەی کانییەکە دانیشتبوو.)* ف دیوار دور حوض و چشمە

**کەوی گوڕەڵی**: خاسەکەو، کەوێک کە باش دەخوێنێ و بۆ کێبەرکێی کەوان ئازایە و لە خوێندن ماندوو نابێ. ف کبکی کە خوب می‌خواند و در مسابقە کبک‌خوانی خستە نمی‌شود

**کەوی**: گزینگ، سەرەتای تاوی بەیانی. ف اولین تابش نور خورشید

**کەویلکە**: نوابەفر، بەفرێکە کە جێجێ توابێتەوە. *(ئەمن زەینی خۆم دەدایە تیرەگی دەکوێستانی/ سەریان دەردیناوە لەبن کەویلکەی دەبەفری/*

پنجی سوینسنی، هەلالی، بەیبوونی، گیابەند و گیاخاوی/ دەگەڵ پەلکی دەسووره گوڵی «فولکلور».) ف برف اندک

**کەوێن**: خاوێن، پاقژ، پاکژ. ف پاکیزه

**کەهال**: بۆنی خۆڵی ئاوپرژێن کراو. *(گوند بۆ کەهالەکەشی پیاو مەست دەکا.)* ف بوی خاک آب پاشیده

**کەیکەو**: کەیکەب، کەیکف، دارێکی جەنگەڵییە بەر ناگری. *(ئیستر بزایە کەیکەو بارو‌بەر/ ئەوسا دەبینی تو بالای دلبەر «فولکلور».)* ف نام یک درخت جنگلی

**کێچ بە گا فرۆشتن**: بریتی لە فێڵ کردن و شتی هەرزان بە نرخی گران فرۆشتن. *(ئەو کلاوچییە کێچ بە گا دەفرۆشێ.)* ف کنایه از بسیار شیاد

**کێچ لە کەوڵ کەوتن**: ) بریتی لە وەپەلە کەوتن بۆ کارێک. *(تازە کێچ کەوتۆتە کەوڵی مەدادانی نییە.)* ؛ ) کەسێک کە کێچ هەڵدێنێ، کێچ هەڵێنان. ف ) کنایه از عجله داشتن برای کاری؛ ) پیدا شدن کک در لباس و بدن

**کێچ نال کردن**: بریتی لە زۆر فێڵەباز. *(مێندە زۆرزانە کێچ نال دەکا.)* ف کنایه از شیاد و کلاهبردار

**کێچوولە**: جۆرێک گیانلەبەری وردە بەلای برکەی بێستان و چەوەندەر و گیای ساوایە. ف حشره‌ای که آفت بوته جالیز است

**کیرکەڵەگا**: چلوورەی دەم پلووسک، شووشەسەهۆڵ. ف یخی که از ناودان آویزان می‌شود

**کیرەوڵ**: ئەو شوێنەی کیری جوانەگای لێوە دێتە دەر، شۆرەکەی بەر زگی پاتاڵی نێر. ف جایی که آلت تناسلی حیوان نر از آن بیرون می‌آید

**کیرەوڵ شۆڕ**: جۆری جوانەگای زەبەلاحە کە کیرەوڵی شۆڕە و بۆ جووت بوون ئازا نییە. ف گاوی که محل آلت تناسلی‌اش آویزان است

**کێزر**: پیرە داری مازوو و بەڕوو. ف درخت پیر بلوط و مازووج

**کیسۆبزنە**: کەرتەشی، کەرگەتەشی. ف گیاهی خاردار

**کیسەبیمار**: فەقیر، دەستکورت، هەژار. ف فقیر، تنگدست

**کیسەڵ پسەکێن**: کیسەڵ بەخش، گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە. دوو لاو دەستەوئەژنۆ ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشن هەر یەکی قوڵەدارێک لە بەینی هەنیشک و چۆکیانەوە ڕەت دەکەن و دەستیان توند دەبەستن دەبێ بە پەنجەی پێ و بە شان لە یەکتر دەن هەرکامیان بکەوێ ئەوی‌تر بە قوونەخشکێ دەچێتە پێشێ و گازی لێ‌دەگرێ. ف اسم یک بازی جوانان.

**کیسەڵبەخش**: ☜ کیسەڵپسەکێن

**کیسەڵۆکە**: کیسەڵە، سن، بۆگەنکە. ف حشرەی سن

**کیسەڵە**: (+) ) نەخۆشییەکی جەرگی پەزە.) خۆ مات کردن و بە دزە دزە هاتنە پێشەوە. *(ئەوەی دەردە و بەلا باری لە ئاسمان/ لەسەر عەرزی لە دەورم کیسەڵەی بوو. «عەبدوڵلا حەسەن‌زادە، ساکار»)* ف ) غدەی سفید چرکی کە روی جگر

گوسفند پیدا می‌شود.) *بواش بواش جلو رفتن و محاصره کردن.*

**کیسەڵەگزین**: کیسەڵبەخش، کیسەڵ پسەکێن.[ف]
☜ کیسەڵبەخش

**کیسەڵی**: ماشینی ژیان.[ف] فولکس

**کێش**: (+) ) ئایین، مەزەب، دین؛ ) گونجەی دارینی ئەستێر.[ف] ) دین، کیش؛ ) دریچەی چوبی استخر

**کێشتانە**: شاگردانە، دەستخوشانە.[ف] انعام

**کیفوار**: کیفار، نێوی گیایەکی دڕکاوییە، کیوار.
[ف] گیاهی خاردار

**کێلبوونەوە**: هەستانە سەرپێ، ڕاستبوونەوە.
[ف] پاشدن و ایستادن

**کێلگەردن**: بریتی لە گەردنی بەرز و ناسک و جوان، گەردن کێل. *(گەردن زەرد و کێلگەردن، گەردنی زەرد چیی تێدایە/ ملی پڕە لە مووروو نیونێوەی کارەبایە. فولکلور.)* [ف] گردن بلند

**کێلووکە**: داوەڵ، داهۆڵ، ئەو چڵە گەنمەی لەدوای درونێنە بە پێوە دەمێنێتەوە.[ف] شاخه گندم که بعد از درو برجا می‌ماند

**کێلە بەردینە**: یارییەکی منداڵانەیە، چەند بەرد لەسەر یەک هەڵدەچنن و لە مەودای چەند هانگاوییەوە بە بەرد تێی هەڵدەکەن هەر کەس لێیدا و بیڕووخێنی بەرندەیە.[ف] نام یک بازی کودکانه

**کێلەڕێ**: تابلۆ و نیشانەی قەراغ ڕێگا.[ف] علائم کنار جاده

**کێلەکەوە**: گوندێکی ناوچەی فەیزوللابەگی بوو کەوتۆتە بەر سەدی کۆرشی کەبیر.[ف] روستایی در منطقه‌ی فیض‌اله‌بیگی زیر سد کورش رفته است

**کێنی**: گیای دەم دەراوی کانی. ئەو گیایەی لەبەر دەراوی کانی دەڕوێ. *(خواردوومە گیای کێنیتان/ پشقەڵ دەکەم بۆ زستان. فولکلور.)* [ف] گیاهی که در مسیر آب چشمه می‌روید.

**گابۆڕ:** (+) جۆری جۆلانە، چەشنی هەلۆرک. ف نوعی تاب

**گاپا:** گاپێ، بریتی لە تەنبەڵ و لەشگران. ف کنایە از تنبل

**گاپێ:** ☜ گاپا.

**گادل:** بریتی لە مرۆڤی ئازا و بەجەرگ و بەقەوەت. ف کنایە از آدم نترس و نیرومند

**گاردۆن:** مقەبا، قاقەزی ئەستوور کە دەکرێتە جەعبە بۆ کەلوپەل. ف مقەوا

**گارسێوک:** تەرزە، ترگژۆک، تەزرە، تەیرۆک. ف تگرگ

**گارگارە:** بڕبڕەی پشت، بڕبراگە، مۆغەرە، *(گارگارەی پشتم لەوانەبوو بشکێ.)* ف ستون فقرات

**گازاندن:** ) گاز پێدان بە ماشێن و ماتۆڕ و ... *(بیگازێنە با زوو بکەوێن!)* ) نەڕاندن، گاز کردن، هەرا کردن. ف ) گاز دادن ماشین؛ ) جار زدن

**گازوانکە:** گوزروان، گیایەکی گەلا پانی دڕاوییە گوڵی وردی شین دەر دەکا. ف گل گاوزبان

**گازوانە:** گازوانکە، گوزروان. ف گل گاوزبان

**گازۆک:** (+) ) ئەو دارەی کە کەرویشک و ڕێویی لە کون پێ دەردێنن، دارێکی دوو سەرە دەیکەن بە کونی کەرویشک و ڕێویدا لە تووک و پێستەکەی هەڵدەچەقێنن و بای دەدەن و دەیکێشنە دەرێ، بەو دەرهێنانەش دەڵێن چۆلەپێچ، یان چۆلەپێچەن. ) قووڵایی سەری کۆڵەکە بۆئەوەی خەسارە لەسەری ڕاوەستێ. ف ) چوبی کە با آن خرگوش و روباه را از سوراخ درمی‌آورند) گودی بالای ستون کە تیرگ بر آن جای می‌گیرد

**گازە:** (+) پاڕانەوە بە دەنگ، شێعری مناجات. ف مناجات

**گازەندەوان:** دادخواز، شکایەتکار. ف دادخواه

**گازەنگ:** کەڵەزەنگ، زەنگی گەورەی کلیسە. ف ناقوس

**گاشکە:** کارچڤ، هەڵووژە، هەڵووچە. ف آلوزرد

**گاگر:** زەویی بەردەڵان و ڕەقەن. قاقڕ. ف زمینی

که برای شخم مناسب نیست

**گاگلینە:** تاتوولە، گیایەکی ژەهراوییە پاتاڵ بیخوا پێی دەمرێ.ف گیاهی سمی که هر حیوانی بخورد می‌میرد.

**گاڵتەجاڕ:** گەپچاڕ، ڕشقنجاڕ.ف تمسخر

**گامەرز:** هۆگان، سەرەگاوخان، ئەو شوێنەی خەتی جووت دەگاتە ئەوسەر و دەگەڕێتەوە سەر خەت.ف محل دور زدن در شخم

**گاو:** (+) تەقەڵ، دروومان.ف بخیه

**گاوبەن:** ☜ گاوبەند

**گاوبەند:** گاوبەن، شوێنی بەستنەوەی ڕەشەوڵاخ لە تەویلەدا.ف محل بستن گاو در طویله

**گاورمە:** گۆگەم، گیایەکی گەڵا تووکنی گوڵزەردە.ف جوجم

**گای قەشقە:** ) بریتی لە کەسێک کە هەر کارێک بکا دیارە و لەبەرچاوە؛ ) گای نێوچاوان سپی، قەشان، بەش.ف ) کنایه از کسی که هر کاری می‌کند مردم می‌دانند و تابلو شده‌است؛ ) گاو پیشانی سفید

**گجی:** زیادە گۆشتێکە لەنێو زێی مانگا پەیدا دەبێ و دەبێتە هۆی ئەوەی هەمیشە بەکەڵ بێ و لە کەڵ نەچێتەوە.ف گوشتی اضافی که در فرج گاو ماده پیدا می‌شود

**گدیش:** گەڕاگوهان، توربەی گوانی ئاژەڵ، گواندین.ف پستان حیوان

**گدێو:** هەتیو، سێوی، منداڵی بێ‌دایک و باوک.ف یتیم

**گراو:** ماشقە، دەزگیران، یار. دڵبەر.ف معشوقه

**گراویلکە:** ماشقەی جوان و چکۆلانە، یاری منداڵ و وردیلە.( کورێکی قەشمەری کوردی گەشاوە/ چخوشە هەڵکەوێ بکرێ بەزاوا/ گراویلکەی بەبووکی بێتە بەر دەست/ هەوێردێکی حەمایت بێ نە بەیدەست.«ڕاوچی») ف معشوقه کوچولو

**گرتن:** (+) ڕام کردنی جوانووە ئەسپی سواری. *(ئێستا جوانووەکەمان نەگرتووە.)* ف رام کردن کره‌اسب برای سواری

**گرخم:** وردە برشتی بەنی فەڕەش لە کاتی تەون کردندا.ف ریزه‌های نخ در قالیبافی

**گردەبنە:** خڕیلانە، کوڵەبنە، *(پیاوێکی گردەبنەیە.)* ف کوتوله

**گردەشان:** تیرەشان، لاشانی کێو، قەدی چیا.ف سینه‌کش کوه

**گردەڵە:** (+) گرۆڵ، کوتە پارچەیەکی چوارگۆشە لەبن باخەڵی کراسی دەدروون.ف تکه پارچه‌ای چهارگوشه برای زیر بغل پیراهن

**گردیشک:** گیایەکی خۆڕسکە وەک شنگ وایە، ئاڵەکۆک، هەڵاکۆک.ف نام گیاهی است

**گردیگلان:** ) گردێک کە سواری لێ‌دەگلێ؛ ) ناوی گوندێکە لە هەڤدە کیلۆمەتریی باشووری شاری بۆکان هەڵکەوتووە.ف ) تپه‌ای که سوارکار به زمین می‌خورد؛ ) نام روستایی در هفده کیلومتری جنوب بوکان

**گردیلکە:** کووپەڵە، گەردیلە، کووپە پەنیری چکۆلە.ف کوزه‌ی کوچک

**گرژینەوە:** زەردە گرتن، بزە، نەرمە پێکەنین. زەردەخەنە.[ف] تبسم

**گرسڤا:** گەردنی جوان و سپی و ناسک، گەردن زەرد.[ف] گردن زیبا و سفید

**گرسۆز:** جۆری لامپای شووشە باریکە و گرەکەی گردە چونکە پلیتەکەی وەک پلیتەی سەماوەر و عەلادین لوولەییە.[ف] چراغ گردسوز

**گرسەژۆ:** بلیسەکێشان، کلپە کردن، *(ئاورەکە گرسەژۆی دەکرد بۆ سەر و چاومان.)* [ف] زبانە کشیدن

**گرگرە:** کۆل و بیر، جەغجەغە، چەرخی ئاو هەلکێشان لە بیر.[ف] چرخ آب کشیدن از چاه

**گرمخین:** رزین، گەنین.[ف] گندیدن

**گرمخیو:** رزیو، گەنیگ، گەنی. *(میوەکە کشتی گرمخیوە.)* [ف] گندیده

**گرمۆتکە:** گرمۆتە، گرموولە، گزموول.[ف] گلوولەی گل و مو

**گرمۆتکە:** گرمۆتە، گرمۆلە. *(خۆی لەو بن دیوارە گرمۆتکە کردووە.)* [ف] گلوله

**گرۆس:** کاکیلە، خلێنە، کاکیلکە.[ف] دندان آسیاب

**گرە بەرد:** بەردی زبر و زۆپی کێو، *(لەسەر گرد بەردەکان راوەستابوو.)* [ف] سنگ زبر و برجسته در کوه

**گرەسی:** ماسین و تەب کردنی سیپەلک.[ف] التهاب ریوی

**گرەڤ:** باوەر، ئیمان، بروا. *(مرۆڤەکا خاوەن گرەڤە.)* [ف] ایمان

**گریال:** کەچەل، سەر گەنیگ.[ف] کچل

**گرینج گرینج:** گرنی گرنی، زبر. *(لەسەر ئەو بەردە گرینج گرینجە دانیشتووە.)* [ف] زبر

**گرینچۆ:** جمگە، خرتک، *(گرینچۆی دەستی ترازاوە.)* [ف] مفصل

**گزگزە:** مێشە گزگزە، مۆز، جۆری مێشی سەوزی گەورەیە بە ئاژەڵەوە دەدا.[ف] کنکاون

**گزۆک:** گزەون، گزیکار. *(رووترش و گزۆک و گوی نەبیستوو/ گرژ و مرومۆچ و کەس نەویستوو «مەم و زین».)* [ف] کلاەبردار

**گزینە:** چەکوش، چەکوچ. *(ئەو گزینە بێنە بزمارەکە داکوتە.)* [ف] چکش

**گژنیژە:** (+) گۆی مەمکی ئافرەت.[ف] نوک پستان زن

**گسکە سواخ:** سواخدانی دار و دیوار بە گسک و قورە شلە. قوراوێکی شل بە گلەسپی دەگرنەوە و گسکەکەی تێهەڵدەکێشن و بە دیواریدا دێنن.[ف] گل‌اندود دیوار با جارو

**گسکە فەقێ:** گیایەکە گوڵی زەرد و سوور دەر دەکا وەک گڕاڵک وایە بەڵام لقەلقە شین دەبێ و نیو مەتر بەرز دەبێتەوە بۆ گەسک کەڵکی لێ وەردەگرن.[ف] گیاهی است برای جارو

**گسکەچۆمی:** جۆرێک گیای بالا بەرزە لە قەراغ چۆم دەڕوێ و لاسقەکەی مەیلەو سوورە بۆ گەسک کەڵکی لێوەردەگرن.[ف] گیاهی برای جارو

**گسکەشینە:** گیایەکە لە بەراوان شین دەبێ بۆ گەسک کەڵکی لێ وەردەگرن.[ف] گیاهی است

برای جارو

**گسکی بەداری**: یارییەکی منداڵانەیە گسکێک بە دارەوە دەبەستن و وەک ئەسپ سواری دەبن و هەڵدێن گسکەکە لە دواوە لە عەرزی دەخشێ و تەپوتوز دەکا.ف یک بازی کودکان مانند نیسوار با چوب و جارو

**گشپێش**: جەوی هەوای دەوری زەوی.ف جو زمین

**گف کردن**: ڕق هەستان، خۆ هەڵمەساندن. *(لە داخانا خوی گف کردبوو.)* ف عصبانی شدن

**گلارک**: ☜ گلارکە

**گلارکە**: گلێنەی چاو، گلارک، بیبیلە.ف کرەی چشم

**گلگوکەرە**: تاقتاقکەرە، تووتەک.ف مرغ شب‌آهنگ

**گلمووچک**: گزمووڵە، گڵمووچە.ف گلولە گل

**گلمووچە**: گزمووڵە قوڕ.ف گلولە گل

**گلۆرە**: گولۆلە، بەنی خڕ هەڵکراوە.ف گلولە نخ

**گڵەپنج**: گلێکی سپییە لەگەڵ لۆکە و زەردێنەی هێلکە تێکەڵی دەکەن بۆ چاککردنەوەی درزی دیزە و گۆزە کەلکی لێوەردەگرن.ف نوعی خاک آهکی کە با پنبە و زردەی تخم‌مرغ قاطی می‌کنند برای ترمیم کوزە و ظرف سفالی شکستە

**گڵەپۆتە**: خۆلەپوتە، خۆلەپۆتێنە، گڵەپۆک، گڵی وشک و ورد.ف خاک خشک و پودر مانند

**گڵەپۆک**: ☜ گڵەپوتە

**گڵەت**: جار، ڕا، کەڕەت. *(ئێ گڵەت هاتی سەردە لیمان.)* ف دفعە

**گڵەسەر**: (+) گڵەبان، کای کۆماکراوی گڵ بەسەردا کراو بۆئەوەی تەڕ نەبێ. *(ئەو کاوگزرەیە بەرە هەڵیدەوە و گڵەسەری بکە با خەسار نەبێ.)* ف ریختن خاک برروی تودەی کاە.

**گڵەمردە**: گڵەپۆتە، گڵی داوەریوی بیری وشک. ف خاک پودە

**گلیڤان**: گلەیی‌کار، گازەندەوان، خۆشگلەیی.ف گلەگذار

**گلێنک**: گلێنە، گلارک، بیبیلە.ف کرەی چشم

**گلێنکە**: گلێنە، گلارک، بیبیلە، گلێنک.ف کرەی چشم

**گمتە**: قەلب، خوێری، بەرەڵلا و بێکەلک. *(ئەو کەرە گمتە بەکار نایە بۆیە بەرەڵلا کراوە.)* ف بی‌ارزش

**گنە**: (+) پۆلکە، گاگووز.ف خلر

**گوارا کردن**: ڕابواردن، بەسەر بردن.ف تفریح کردن

**گوارەمەرە**: گۆشتێکی زیادییە وەک گولنگ بە بەر ملی هێندی مەردا شۆڕ دەبێتەوە.ف منگولە گوشتی زیر گردن بعضی گوسفند

**گوان‌ترسێن**: بە باوەڕی خەڵکی عەوام چاک کردنەوەی گوانی هەڵمەساوی مانگایە بەدەستە گورگ، واتە دەستی گورگ دەپەڕێنن و دایدەنێن، هەر کاتێک مانگا گوانی دەماسی دەستە گورگەکەی پێدا دەهێنن چاک دەبێتەوە ف درمان کردن پستان گاو مادە با دست گرگ

هنگام آماسیدن

**گواندێن:** (+) توورەکەیەکە بە گوانی ئاژەڵیدا دەکەن بۆئەوەی بێچووەکەی نەیمژێ، یان دڕوودال برینداری نەکا.ف پارچەای کە برای پوشیدن پستان حیوانات می‌دوزند تا بچەاش شیرش را نمکد و خار و خاشاک زخمیش نکند

**گوانە ڕەقە:** نەخۆشییەکی گوانی پاتاڵە.ف بیماری کالاکسی

**گوانە مانگا:** گیایەکە بۆ دۆکولیو دەبێ.ف نام گیاهی خوراکی برای آش دوغ

**گوانەمە:** بە گوانی حەیوانێک دەگوترێ کە هاتوتە سەر زان.ف پستان حیوانی کە آمادە تولیدمثل است

**گوپاک:** وتە خاوێن، قسە جوان، *(وێژەرێکی گوپاکە.)* ف سخن پاک

**گوپاڵ زیوێن:** ناوی وەزیر لە کایەی میرمیرێندا. ف وزیر در بازی میرنوروزی

**گوپکە:** گژنیژە، گۆی مەمک، *(لێت ڕاهاتووم، وەکوو منداڵ لە گوپکەی مەم. «عەبدوو للا پەشێو»)* ف نوک پستان

**گۆتان:** پەرچە، جێگە مۆڵی مەڕ لە چیا. *(مەڕەکەیان بۆلای گوتان ڕادا.)* ف محل استراحت دام در صحرا

**گۆج پێهێنان:** تەنگەتاو کردن، ئۆقرە لێهەڵگرتن. *(ڕوومەت و کولمە و چەنە و بەرخەبەبەی/ گوجی پێهێناوی چۆن ڕێ دەردەبەی. «هێمن»)* ف بی‌قرار شدن

**گوجایز:** شیاو، هێژا، *(ئەوکارە وە ئێوە گوجایز نییە.)* ف لایق

**گوجەستەک:** نەگریس، نەگبەت. *(پیاوێکی پێڕەش و گوجەستەکە.)* ف شوم

**گۆڕایی:** دەشتایی، تەختان، دەشتان. *(لەو گوڕاییە ئاژەڵەکان بلەوەڕێنە.)* ف زمین هموار

**گۆرتە:** ئەو مەڕمەڕە گەورەی بە دوو قامک گۆرتێنی پێدەکەن.ف تیلەی بسیار بزرگ

**گۆرتێن:** کایەیەکە بە هەڵماتی زۆر گەورە دەکرێ هەر بە پاوە بەدەست لە نیشانەکەی هەڵدەکەن.ف نام یک بازی با تیلەی خیلی بزرگ

**گوردە:** ) بزنی گوێ پان و شۆڕ؛ ) بریتی لە پیاوی بێغیرەت و تەرەس.ف ) بز گوش پهن و دراز؛ ) کنایە از مرد بی‌غیرت و دیوس

**گوردەوشێرە:** ڕایەڵی مافوورە، گورد ڕایەڵی پشتەوەیە و شێرە ڕایەڵی پێشەوەیە.ف تارهای قالی

**گوڕڕە:** ) کێ بەرکێ، ڕقە، ملە؛ ) هەراهەرا، *(دەستیان کردووە بە گوڕڕە و هەرا.)* ف ) رقابت، مسابقە؛ ) سروصدا

**گۆڕکەن:** (+) جانەوەرێکی بۆرە بەقەد پشیلە دەبێ گۆڕ دەداتەوە.ف گورکن

**گورگ پێ:** کەسێک کە پەنجەی لاقی خوار و خێچە.ف کسی کە انگشت پاهایش کج و کولە است

**گورگاسە:** پشیلە کێوی.ف گربەی وحشی

**گورگە سوورە:** ناوی گیایەکە.ف نام گیاهی است

**گورگەڕاو پێکردن:** بریتی لە ئازار و

چەرمەسەری دان، هێنان و بردن و سەرلێشێواندن. *(گورگە راوێکیان پێکرد سەگی لەپاشەوە نەدەژیا.)* ف دنبال کردن و آزار دادن

**گورگی بیچوو خوراو**: بریتی لە کەسێک کە زەبری وێ کەوتبێ و داخ لە دڵ بووبێ و ئامادەی تۆڵە کردنەوە بێ. ف کنایە از آدم داغ دیدە و آمادەی انتقام

**گورم**: شیرخواردنی بەرخ کاتێ بە توندی سەری لە گوانی دایکی دەکوتێ. *(گورمێکی لە گوانی دایکی‌دا.)* ف کلە زدن برە بە پستان مادرش هنگام مکیدن

**گورمەتە**: شاتاوڵی بەتوندی، گورم، هاشاوڵی بە تەوژم. ف با شیرجە حملە کردن

**گورمیلە**: خڕ و تۆپ، گزموولە، تۆپەڵە. *(بە قوڕ گورمیلەی دروست دەکرد.)* ف گلوولە

**گوڕنی**: لەخۆبایی، بەفیز، بەدەمار. *(وا گوڕنی بووە قسە لەگەڵ کەس ناکا.)* ف مغرور

**گورووپ**: تاقم، دەستە. ف گروە

**گورووپی خوێن**: جۆری خوێن. ف گروە خون

**گوڕەکەو**: کێبەرکێی خوێندنی کەو. ف مسابقەی کبک‌خوانی

**گۆڕەوابازی**: جۆراوێن، گۆرەوی‌بازی. ف جوراب‌بازی

**گۆرەوی بازی**: جۆرابێن، جۆراوێن، گۆرەیبازی. ف جوراب بازی

**گۆڕەوینە**: گۆڕینەوە، ئاڵوگۆڕ. ف معاوضە

**گۆڕەهوو**: مردووی بێ‌گوڕ و بزر بوو، مردووی بێ‌سەر و شوێن. *(مردووە و خودا دەزانێ لە کوێ گۆڕەهوو بووە.)* ف مفقودالاثر

**گۆڕەیبازی**: ☜ گۆرەوی بازی

**گوریس داخستن(راخستن)** : بریتی لە تەماحی زۆر. *(بابم خۆ گوریسم بۆ رانەخستووە.)* ف کنایە از طمع و آز زیاد

**گوریک**: دەزوو، قرقرە. ف نخ

**گورینگ**: گوڵینگ، گوڵنگ، گوڵینکە. ف منگولە

**گوریەچنە**: گورەوی‌چنە، گورەویلکە. ف پرندەی چرخ‌ریسک

**گۆزەڵدان**: جێگای دەفر و گۆزە لە ماڵدا، ئەو شوێنەی گۆزەی پڕ لە ئاوی لێ‌دادەنێن. ف محل گذاشتن کوزە آب در منزل

**گۆزنگری**: ) گرێ‌پووچکە، گرێ کوێرە؛ ) پشتێنی گرێچن، پشتێنی گرێ‌گرێ. ف ) گرە کور؛ ) کمربند گرەدار

**گۆزە بە دوودا شکاندن**: بریتی لە بەڕێ کردنی کەسێک بە بێزارییەوە و بە هیوای نەدیتنەوە. ف کنایە از بدرقە کردن کسی با بیزاری و بە امید دوبارە ندیدنش

**گۆژمە**: (+) ) گورج، چالاک، هەڵسوور، ) مەبلەغ، بڕ، «بۆ پارە».. ف ) چست و چالاک ) مبلغ..

**گۆشتەژوو**: ☜ گۆشتەوزوین

**گۆشتەوزوین**: گۆشتە زوون، گۆشتە زوونە. ف ترمیم زخم

**گۆشتی برژاو و دەرنەچوون**: بریتی لە شەڕ و تەقەی زۆر و پڕ مەترسی. *(شەڕێکە گۆشتی برژاو دەرناچێ)* ف کنایە از جنگ و درگیری خطرناک

**گۆشتی گەردەمل**: بریتی لە ملۆزم و مێمل، کەسێک کە پیوەت دەنووسێ و دەستبەردارت نابێ. *(لێم بۆتە گۆشتی گەردەمل، دەستم لە کۆڵ ناکاتەوە.)* ف کنایه از مزاحم، موی دماغ

**گۆشە بەرخیلە**: گوێ بەرخۆلە، گیا بەرخۆلە، گیایەکە بۆ دۆکولێو دەبێ. ف نام گیاهی خوراکی

**گۆفک**: (+) ئیلمە، پۆ. ف پود

**گوڵ ئەستێرە**: (+) ناوی گوڵێکی زەردە. ف گل ستاره

**گوڵ پەنا**: گەنمێک کە درەنگ دادەچێندرێ و گوڵ ناکا. ف گندمی که خوشه ندارد

**گوڵ کردن**: لە یاریی قەرێ قەرێدا ئەو کەسەی لەسەر شارە و چاوی گرتووە دەست لە هەرکام لە منداڵەکان بدا دەڵێن گوڵی کردووە و دەبێ بچێ چاو بگرێ. *(برۆ چاو بگرە گوڵ بووی.)* ف اصطلاحی در قایم باشک بازی

**گـوڵ** (+) قوڵفەی چنین لە گـۆرەوی و دەستکێشدا. ف حلقەی نخ در بافتنی

**گوڵباتمان**: پارچەیەکی قەدیمی ژنانە بوو دەیانکردە کراس. ف نام پارچەای قەدیمی

**گوڵبوێر نەکردن**: پشتگوێ نەخستن. *(مێندە کاری جوانە گوڵبوێری ناکا.)* ف پشت گوش نیانداختن.

**گوڵبە**: گوڵبینە، گوڵوە، هەواکێشی تەندوور. ف هواکش تنور

**گوڵبێچوو**: قوماشێکی ژنانەی قەدیمی بوو دەیانکردە کراس. ف نام پارچەای قدیمی

**گـوڵپڕچن**: قەرە، ئەو خرچەیەی هەر لە بێستانەکەدا بە برکەکەیەوە دەیخەنە بن گڵ تا دەبێتە کاڵەک. *(عەمر و دیدەم شەکرەژن/ سنگ کاڵەکی گوڵپڕچن/ کووزت کەن بتدەن بە من «گۆرانی»)* ف خربزەی کال که در جالیز زیرخاک قرار میدهند تا میرسد.

**گوڵپیتە**: گوڵی قانگەلاشک، سەلکی درووی کنگر. ف گلبتەی کنگر

**گوڵتوپ**: ☜ گوڵهەن

**گۆڵخنکێن**: پەلاماری کەسێک دان و بەتەواوی شەل و کوت کردن. *(رقم هەستێنی دەتکرم گۆڵخنکێنت دەکەم.)* ف کنایه از زدن و تنبیه کردن

**گولدووزام**: شلە، کەسێک کە دەم و چاوی پەلەپەلەیە. ف صورت پر از لکه

**گوڵزاغ**: پارچەیەکی قەدیمی بوو دەیانکردە کراس. ف نام پارچەای قەدیمی

**گوڵسوو**: گزنگ، شەبەقی بەیان، سەرەتای تاوی بەیانی. ف اولین نور خورشید در صبحدم

**گۆلقەند**: برێشکەی گەرمەشانی و شیلەی قەند کە توپەڵ توپەڵی دەکەن و دەیفرۆشن. ف شیره زرت

**گۆلکاو**: گۆلاو، گۆلی چکۆلە. ف آب جمع شده در گودی

**گۆلکێش کردن**: پەت لە ملی کەسێک خستن و بە زۆر بەدوای خۆدا راکێشان. ف طناب به گردن کسی انداختن و به زور کشیدن

**گوللەی وێڵەکی**: گوللەی وێل، تیری نەبەدی. ف

گلوله‌ی بدون هدف‌گیری

**گولم**: سواڵه، قوڵه گه‌نمی دروینه کراو.[ف] دسته گندم درو شده

**گولمانج**: ئه‌ستیر، هه‌سێل، ئاقزیل، گۆلاو.[ف] استخر

**گولمه‌پت**: کونه لووت، کونه که‌پۆ.[ف] سوراخ بینی

**گوڵوڵ**: جۆری گوڵه‌باخی ره‌نگ ئاڵه و مه‌یله‌و زه‌رده.[ف] گل رز

**گولوه**: ☜ گولبه

**گوله به‌رزانی**: گیایه‌کی بالا به‌رزه گوڵی زه‌رد ده‌ر ده‌کا و له‌نێو مێرگ و قوپیدا شین ده‌بێ.[ف] نام گیاهی است

**گوله چاوپشیله**: گوڵێکی زه‌رده وه‌کوو نێرگز وایه.[ف] گلی مانند نرگس

**گوله چه‌رمه‌ڵه**: ☜ گوله سپیلکه

**گوله حاجیانه**: گوله چاوئێشه، به‌یبوون، حاجیله، شێر و شه‌پاڵ.[ف] بابونه

**گوله دووپشکه**: ناوی گوڵێکه.[ف] نام گلی است

**گوله سپیلکه**: ☜ گوله حاجیانه

**گوله سوورکه**: رێحانه کیویله، گیایه‌که که‌ڵای له رێحانه ده‌چێ و له دێم و بووره شین ده‌بێ.[ف] نام گیاهی است

**گوله مه‌خمه‌ر**: گوڵێکی گه‌ڵا بنه‌وشه له گوڵداندا په‌روه‌رده ده‌کرێ.[ف] نام گلی است

**گوله‌برێژ**: گه‌بابی به‌رگ.[ف] کباب برگ

**گوله‌ما**: هه‌وێنی په‌نیر.[ف] مایه‌ی پنیر

**گوڵهه‌ن**: گوله به‌ڕۆنه، گوڵتوپ.[ف] انسنتین

**گولی به‌خیل**: بریتی له مرۆڤی به‌خیل و به‌رچاو ته‌نگ، یانی که‌سێک که خۆی گول بوو پێی‌خۆشه هه‌موو که‌س گول بێ. *( بۆ پێم ناخۆشه ماڵت کرپوه، خۆ گولی به‌خیل نیم.)* [ف] کنایه از آدم حسود

**گولێن**: توپێن، کایه‌ی توپی پێ.[ف] فوتبال

**گومان**: (+) ره‌هه‌ندی نێو بیر، که‌ریز.[ف] کهریز

**گومبه‌ته**: خۆ بۆ فرێدان. *(گومبه‌ته‌ی له‌خۆی دا و بۆی چوو.)* [ف] شیرجه زدن

**گوموگۆڕ**: شرتوگوم، بزربوو، وندا. *(ئاگات له شته‌کانت بێ گموگوریان نه‌که‌ی.)* [ف] گم و گور

**گومه‌یل**: کفته.[ف] کوفته

**گومیچکه**: گۆمی چکۆله، گۆماوێک که زۆر قووڵ و به‌ربلاو نییه.[ف] ژرفاب کوچک

**گون پێ بزوان (نه‌بزوان)** : بریتی له گوێ پێنه‌دان و به هیچ نه‌زانین. *(جا ئه‌وه چییه قسه بکا و قسه نه‌کا هه‌ر گونیشم پێی نابزوێ.)* [ف] کنایه از اهمیت ندادن و به حساب نیاوردن

**گون له زگ**: پیاوێک که چووکی ده‌چێته‌وه نێو زگی و کاتی هه‌ڵنه‌ستاوه هیچی دیار نییه.[ف] مردی که آلت تناسلی‌اش قبل از نعوظ در داخل شکم قرار دارد

**گونکه‌ژمار**: بریتی له قرنیس و مسته‌قووچاو، سه‌قیل، یانی گونکی هه‌ویر ده‌ژمێرێ.[ف] کنایه از کسی که بسیار خسیس است و چونه نان را می‌شمارد

**گونگونه سه‌گانه**: (+) گیایه‌که به بنج ده‌روی گه‌لاکه‌ی وه‌ک میکووک وایه و به‌رێکی وه‌ک

قەیسی دەگرێ، گونە سەگانە.[ف] اسم گیاهی

**گونە سەگانە:** ☜ گونگونە سەگانە

**گونەر:** هەڕەت، تاف، جەنگە. *(هەنوو گونەرا گژ و گیا دوورینە.)* [ف] فصل، زمان

**گونەقەلە:** جۆری تریی ڕەشی پێست ئەستوور و ناخۆشە.[ف] نوعی انگور

**گونینە:** ترخێنە، شەلەمین، چێشتی شێلم و دان. [ف] ترخینه

**گووچارنەک:** کلک هەڵتەکێنە، قوون هەڵتەکێنە، چۆلەکەیەکە کاتێک دەنیشێ کلکی هەڵدەتەکێنێ. [ف] دم جنبانک

**گووخلێرکە:** گووگلێنە، گووخلینکە.[ف] سرگین غلطان

**گووخلێنکە:** ☜ گوو گلێنە

**گوڕووشکێن:** ئەو شتەی دەیدەن بە منداڵ لە کاتی گوڕوو گرتندا بۆئەوەی بەهانەی نەمێنێ و نەگرێ.[ف] چیزی که به بچه می‌دهند که بهانه نگیرد

**گووف:** مۆڵ، جێگەی خەوتنی گاڕان لەکێو.[ف] محل استراحت احشام در صحرا

**گووفیرە:** گووی شل، ڕیخەتاڵە[ف] مدفوع هنگام اسهال

**گووگلێنە:** گووخلێنکە، گووخلێنە، گووخلێرکە.[ف] سرگین غلطان

**گوونەکەر:** بریتی لە سەقیل . نینۆخۆشک، چکووس، مستقووچاو، *(دەس‌ڕژد و چنۆک و گوونەکەر بوو/ بێ‌دۆست و قزە و نەزان و کەر بوو. «مەم و زین».)* [ف] خسیس

**گوێ پرووسقێنە:** کایەیەکی منداڵانەیە، کەسێک لە دوور ڕادەوەستێ و شتێک فڕێ دەدا بۆ دەستەیەک منداڵ هەر کەس هەڵیبگرێتەوە بە هەموویان گوێی دەکێشن هەتا لێی دەستێنن، بەڵام هەر منداڵێک ئازا بێ هەڵیدەگرێتەوە و خۆی دەگەیێنێتە ئەو کەسەی شتەکەی فڕێداوە، کاتێک دەستی لێدا شتەکە دەبێتە هی خۆی و ئیتر هەقیان نییە گوێچکەی بکێشن و لێی بستێنن.[ف] نام یک بازی

**گوێ گەزیزە:** کاژیلەیەک کە گوێچکەی خاڵ خاڵی ڕەش و سپی تێدایە و شێوەی گوڵە گەزیزە دەدا.[ف] بزغاله‌ای که گوش خال خال دارد.

**گوێئاسارە:** گوڵەستێرە، گووئەستێرە، پەنگرەستێرە.[ف] کرم شبتاب

**گوێچکەم هەرزن هەڵدەگرێ:** بریتی لە زۆر لەسەر هەستبوون، کەسێک کە گوێی سووکە و زوو حاڵی دەبێ. *(هەر سرتەت بێ حاڵی دەبم، گوێچکەم هەرزن هەڵدەگرێ.)* [ف] گوش بسیار شنوا

**گوێڕادێر:** گوێڕایەڵ، کەسێک کە بە جوانی گوێ ڕادەگرێ و دڵ بە کار دەدا.[ف] حرف‌شنو

**گوێرچ:** گوێژ، گێوژ.[ف] زالزالک

**گوێرەوسار:** گوریسی باریکی بەستنەوەی گوێلک.[ف] ریسمان بستن گوساله

**گوێزلەمە:** شیرینی بە گوێز و شەکر دروست کراو.[ف] شیرینی گردویی

**گوێزە چەوەندەرە:** جۆرێک گوێزی دەنک

گەورەیە.ف نوعی گردوی درشت

**گۆیژە ڕیخە:** ☜ گیوژە ڕیخە

**گۆیژە زەردە:** جۆرێک گوێژە ڕەنگی زەردە.ف زالزالک زرد

**گوێژە سوورە:** جۆرێک گوێژی سوورە.ف زالزالک سرخ

**گۆیژە کۆلە:** ☜ گیوژە کۆلە

**گۆیژە مۆرە:** ☜ گیوژە ڕیخە

**گوێکەرە:** گیایەکی گەلا پان و تووکنە وەک سیفەڵووکە وایە بەلام ڕەنگی ئەم سپیواشە بە پۆل دەڕوێ، گیاپەڕۆ.ف اسم گیاهی است

**گوێکەرە:** جووڵەوەرێکە وەک هەزارپێ بەلام لاقی کەمترە و دەڵێن دەچێتە گوێچکەوە پیاو کەڕ دەکا.ف جانوری مانند هزارپا کە در گوش آدم فرو میرود و کرش میکند

**گوێلپار:** پارگوێر، گوێرەکە، گوێلکی دوو ساڵان. ف گوساله دو ساله

**گوێنۆ:** ☜ گوڵە بەرزانی

**گوێیانە:** گووشی.ف گوشی تلفن و ...

**گەبەر:** (+) بن باخەڵ، بنکەش، بن هەنگڵ.ف زیر بغل

**گەچۆڕ:** شۆرەکات، زەوینی بێگیا و گژ و سوێر.ف شورەزار

**گەراپێچە:** گێژەڵووکە، گەردەلوول، بابلیسک، عێوارەش، زەمەن، گەردەچویچە، باهۆز، گەژگەرینگ، گەردەبل، گەرەپیچ، باپیلیک، گێژەڵە، سایلکۆن، گەردەگووچان، باگرۆکە، گێجەلووکە، گەردەچویچان، شایی جندۆکان، وێولە جنانی، گەردەلوور، وەیوولە، باگەڕ، شەیەتویتۆن، گەرتەتووچان، گەردەتووچان.ف گردباد

**گەراز:** هەڵووچە، هەڵووژە، گەراس، عەلووکە. ف آلوچە.

**گەراس:** ☜ گەراز

**گەرتەتووچان:** ☜ گەردەتووچان

**گەرجە:** بێچارە، بەدبەخت، چارەڕەش. *(بە ئی کارە ئاخری گەرجەمان کەی.)* ف بدبخت

**گەرچەکە کێویلە:** گیایەکی خۆرسکە دانەکەی لە گەرچەک چکۆلەترە.ف نام گیاهی است.

**گەرد و وەرد:** زەوییەک کە لەدوای شیو بڕینی خێرا وەردی کەنەوە.ف زمینی کە بعد از شخم زدن فوری برای دومین بار شخم بزنند

**گەردن زەرد:** ئافرەتی گەردن و ژێرچەناگە جوان. *(گەردن زەرد و گەردن زەرد گەردنی زەردت هەڵینە/ وەک ماری دیمەکاران شەو هەتا ڕۆژ بخوێنە. «گۆرانی».)* ف گردن بلند و زیبا

**گەڕدە:** نۆرە، نۆبە، کەشە، کەڕەت.ف نوبت

**گەردەتووچان:** گێژەڵووکە، باگەڕ، باهۆز، سایکلۆن.ف گردباد

**گەردەچویچە:** گێژەڵووکە، گەردەلوول، شەیەتویتۆن.ف گردباد

**گەردەگووچان:** گەردەلوول، گێژەڵووکە، باهۆز، گەردەبل.ف گردباد

**گەرماژەک:** گەرماژۆ، گەرمابردە.ف آفتابزدە

**گەرمژ:** (+) گەرمێن، گەرمەسێر، گەرمیان.ف گرمسیر

**گەرمک**: گوندیکی ناوچەی فەیزوللابەگی بوکان بوو کەوتە بەر سەدی کورشی کەبیر.[ف] روستایی در منطقەی فیض‌الـەبیگی زیر سد کورش کبیر رفت

**گەرمەپەرێز**: جارە گەنمێک کە تازە دروێنە کرابێ ئەگەر نەیکێلن و بە جاری بمێنێتەوە بو سالی دوایی دەبێتە ساردەپەرێز.[ف] گندمزاری کە تازە درو شدەاست

**گەرمەژێ**: هەژان و هاسکەهاسکی مالات بەهوی گەرمای زورەوە. *(مەرەکان هەموو تووشی گەرمەژێ بوون.)* [ف] بە نفس‌نفس افتادن گوسفند در گرمای زیاد

**گەرمەشانی**: گولەپێغەمبەرە، گەنمەشامی.[ف] ذرت

**گەرمەشانییە کێویلە**: گیایەکە لە گەرمەشانی دەچێ و لە کێو و بەندەنان دەڕوێ.[ف] گیاهی شبیه ذرت

**گەرمەکەش**: چاندنی بێستان و زەرحات لە کاتی گەرمای بەهاردا. *(بە گەرمەکەش بێستان زوو شین دەبێ.)* [ف] کاشتن جالیز در گرمای بهار

**گەرمەلان**: لانەی تازە چێکراو. لانەیەک کە تازە گەروێشکەکەی لێ هەستابێ.[ف] لانەای کە تازە خرکوش از آن بیرون جستە باشد.

**گەڕۆکەستێرە**: ئەو ئەستێرانەی بەدەوری خوردا دەخولێنەوە.[ف] سیارە

**گەرووەخرە**: گەروو هاتن، چلک کردنی بایەمەی گەروو.[ف] چرک کردن لوزە

**گەروی**: گەروو، ئەوک، قوڕوو.[ف] گلو

**گەڕیان**: (+) ) دایمە لەسەر ڕوێشتن، لەگەڕ. بو شتی ئاوەکی دەگوترێ.) ناوی هەوایەکی گورانیی کوردییە. ) جورێک هەلپەڕکێی نەرمی کوردییە.[ف] جریان

**گەژوو**: ئیشتیا، مگێز، مەگیرانی، بێزوو، مژدی.[ف] ویار

**گەسکەچۆلەکە**: گیایەکە بو گەسک کەلکی لێوەردەگرن.[ف] گیاهی است برای جارو.

**گەسکەتووک**: گیایەکە بو گەسک کەلکی لێوەردەگرن.[ف] گیاهی برای جارو

**گەسکە خانمانە**: گیایەکە بو گەسک کەلکی لێوەردەگرن.[ف] نام گیاهی برای جارو

**گەسکە شوولە**: گەسکێکە لە شوولی باریکی گزێچار دروست دەکرێ.[ف] جاروی از ترکەی باریک درخت گز می‌سازند

**گەسکەمەخمەرە**: گیایەکە بو گەسک دەبێ و لە بەراوان دەڕوێ.[ف] نام گیاهی است

**گەشتوول**: گەڕۆک، گەڕاڵ، گەشتوک، گەڕیدە.[ف] سیاح

**گەل و قەمچاخ**: لە پشتێنە بەرەو خواری مرۆڤ بە تایبەت بو پیاو، گەلوفلت.[ف] قد و قوارە از کمر بە پایین

**گەلابە**: تلێری، ترێلی، ماشینی باری.[ف] تریلی

**گەلاز**: (+) بەرازی پیر، پیرە بەراز.[ف] گراز پیر

**گەلاگەلا**: نانی ناسک و جوان و برژاو. *(دانیشتووی نێو کوشک و قەلا/ دەخون نانی گەلاگەلا؟ «هێمن».)* [ف] نان برشتە و نازک

**گەلاوێژ کەوتن**: گەلاوێژ ئەنگووتن، نیوە بوونی

وەرزی هاوین.[ف] به نیمه رسیدن فصل تابستان

**گەلمیری:** حوکوومەتی خەڵک بەسەر خەڵکدا.[ف] مردم سالاری

**گەڵوان:** بەرێکی دار مازووە.[ف] یکی از ثمرهای درخت مازوج

**گەلۆر:** (+) بەرەڵڵا، لات و بێکارە.[ف] یله و لاقید

**گەلۆفلت:** ☜ گەل و قەمچاخ

**گەلەخوێ:** دەستەی دروێنەوان، گەلە دروێنە. *(خێوی خەرمان خرێ بێ نان دەنوێ/ گەلەخوێ پیوی نەبێ داس بسوێ «هەژار».)* [ف] دستەی دروگر

**گەلەخەندە:** کۆڕێک کە بەبێ هیچ بۆنەیەک بۆ گاڵتە و جەفەنگ کۆ دەبنەوە.[ف] مجلس تفریح و سرگرمی

**گەمحێل:** گەمشۆ، گەلحۆ، گەوج، هەقمەق، حەپۆل.[ف] ابله

**گەمرخە:** کەرۆو، برش، کەرەکیفە. *(نانەکە گەمرخە داکە.)* [ف] کفک

**گەموورە:** (+) تۆفانە، پێشکە، مێشوولە.[ف] پشه

**گەنجمە:** جمین و خزینی زەوی، داخزانی زەوی*(بەهۆی گەنجمەی زەوی لایەکی کێوەکە داڕووخاوە.)* [ف] رانش زمین

**گەندەژە:** (+) بێحەیا، بێئابروو، ماربرژێن، شرودڕ.[ف] بی‌حیا

**گەنگەنەچی:** دەرمانفرۆش، کەسێک کە دەرمانی گەنە دەفرۆشێ.[ف] درمان‌فروش

**گەنمە ئومێدە:** جۆرێک گەنمی دەنک درشتە.[ف] نوعی گندم

**گەنمە پشیلە:** تۆوی شەکرۆکە، تۆوی کەرتەشی.[ف] تخم گیاهی خاردار

**گەنمە سمەوەج:** گەنمێکە لەجێگای کوێستان و زەنویر دەچێندرێ و بە زەحمەت لە کەڵوو دێتە دەرێ.[ف] نوعی گندم

**گەنمە سەرداری:** جۆرێ گەنمە نانەکەی زۆر خوارشتی خۆشە.[ف] نوعی گندم

**گەنمە شووشە:** جۆرێک گەنمە نانەکەی زۆر سپی و جوانە.[ف] نوعی گندم

**گەنمە کابە:** گوڵە پێغەمبەرە، گەنمە شامی.[ف] ذرت

**گەنمە گوڵڕووت:** جۆرێک گەنمە گوڵەکەی قەڵچغی نییە.[ف] نوعی گندم

**گەنمە مەلا:** جۆرێک گەنمە زۆر بڵیند دەبێ.[ف] نوعی گندم

**گەننەموو:** ☜گەنەتووک

**گەنەتووک:** گەندەموو، تووکە مردارە، تووکە منداڕە.[ف] موی زرد جوجه پرنده و موی صورت بچه و زنان

**گەنەجمە:** ☜ گەنجمە

**گەنەسیر:** سیرەگەنە، مووسلی.[ف] موسیر

**گەنەکەولە:** (+) جانەوەرێکی سووری وردە بەسەر پێستدا بڕوا لیرگی پێ‌دەکا.[ف] ساس

**گەنەموو:** گەنەتووک، ☜ گەنەتووک

**گەوار:** بارەکەو، کەوبار، بێچووە کەو.[ف] جوجه کبک

**گەوزە:** هەرزە، بلح و جلف.[ف] سبکسر.

